لە کاتێکدا سەگەکە ئاوی دەخواردەوە ، بزنەکە گیای دەخوارد. تەواوی ئاژەڵەکانی دیکەش بەدوای خۆراکدا دەگەڕان و لە باخچەکەدا هاتووچۆیان دەکرد ، لە ناکاو دەنگێکی بەرزیان بەر گوێ کەوت ، ئەو دەنگە بەرزەش کچە بچکۆلانەیەکی هاروهاج بوو کە تەواوی ئاژەڵەکانی باخچەکە لە هاروهاجی و سەرکێشیەکانی بێزاربووبوون.



ئەو کچە بچکۆلانەیەش ناوی ماشا بوو.



ماشا کچێکی بچکۆلانە بوو ، چاوەکانی سەوز و گەورە بوون ، لێوەکانی هەمیشە بە خەندە بوو ، بەڵام ماشای بچکۆلە زۆر هاروهاج بوو ، حەزی بە سەرکێشی دەکرد و زۆر چاو نەترس بوو. ماشا لە ماڵ هاتەدەرەوە تاوەکو لەگەڵ ئاژەڵەکاندا یاری بکات ، بەڵام چونکە هەمیشە ئازاری دەدان ، هیچ کام لە ئاژەڵەکان ئامادەنەبوون یاری لەگەڵ بکەن و هەموویان خۆیان شاردبووەوە.



کاتێک ماشا هیچ کام لە ئاژەڵەکانی نەدۆزیەوە ، دڵگران بوو. لەناکاو پەپولەیەکی ڕەنگاوڕەنگی بینی. ماشای هاروهاج بێ بیرکردنەوە بەدوای پەپولەکەدا ڕایکرد تاوەکو بیگرێت. ماشا بەردەوام بوو لە دواکەوتنی پەپولەکە تاوەکو گەیشتە خانوویەکی خنجیلانەی زۆر جوان.



ماشای هاروهاج کاتێك ئەو خانووە خۆشەی بینی کەوتە دەستکاریکردنی تەواوی کەل و پەلەکانی خانووەکە و هەمووی بەسەریەکدا شێواند. کاتێك ئێوارە خاوەن ماڵ هاتەوە ، لە بینینی خانووەکەی بەو شێوەیە سەری سوڕما. خاوەن ماڵ مام ورچ بوو کە بە تەنها لەو خانووەدا ژیانی بەسەر دەبرد.



کاتێک مام ورچ چووە ژوورەوە بینی وا کچێکی بچکۆلانە
لەسەر سیسەمەکەی یاری باز بازێن دەکات. مام ورچ ماشای
هەڵگرت و لەماڵ کردیە دەرەوە. بەڵام ماشا سووربوو لەسەر
ئەوەی کە لە ماڵەکەدا بمێنێتەوە. مام ورچ بە ناچاری ماشای
هەڵگرت و بەرەو ناو دارستانە چڕەکە بەڕێکەوت. مام ورچ
ماشای بەتەنها بەجێیهێشت و گەڕایەوە ماڵ.

کاتێک شەو داهات مام ورچ بیری لای ماشا بوو ، بەخۆی وت:"ئێستا دڕندەکانی دارستان ماشا دەخۆن". بۆیە بە خێرایی گەڕایەوە بۆ دارستانەکە و دەستیکرد بە گەڕان بەدوای ماشادا. هەرچەند گەڕا ماشای نەدۆزیەوە. بۆیە بە غەمباریەوە بەرەو ماڵ کەوتەڕێ.





کاتێک مام ورچ گەیشتەوە ماڵ ، بینی وا ماشا لە خانووەکەدایە. مام ورچ زۆر دڵخۆش بوو. بڕیاریدا ماشا لەلای خۆی بهێڵێتەوە. لەو ڕۆژەوە مام ورچ و ماشا بوون بە دوو هاوڕێی زۆر خۆشەویست.



لە ڕۆژێکی فێنکدا ، کە شنەی با بە نەرمی گەڵای سەوزی درەختەکانی دەهەژاند.ماشا لە دارستانەکەدا سەرقاڵی یاریکردن بوو. مام ورچ و ورچەپاندا بڕیاریاندا خوانێکی بەتام بۆ نیوەڕۆ ئامادەبکەن. ورچە پاندا هاوڕێیەکی خۆشەویستی مام ورچ بوو.



ورچەپاندا کتێبی دروستکردنی خۆراکەکەی هێنا تاوەکو خواردنێکی نایاب بدۆزێتەوە. سەرەتا ورچەپاندا قامیشە شەکری هەڵبژارد، چونکە زۆر ئارەزووی بە خواردنی قامیشە شەکر دەکرد. بەڵام مام ورچ خواردنەکەی لەلا پەسەند نەبوو، پەڕەی کتێبەکەی هەڵدایەوە تاوەکو خواردنێکی خۆشیان دۆزیەوە کە ئەویش کولیچەی گۆشت بوو.





مام ورچ و ورچە پاندای بچوک دەستیانکرد بە
دروستکردنی کولیچەی گۆشت..ماورچ ئاردی هێنا و
هەویریان لێ دروستکرد. دواتر پارچە پارچەی بچوکیان
لی جیا کردەوە و ورچە پانداش یەک یەک بە تیرۆکە
بچکۆلانەکەی پانی دەکردەوە. پاشان مام ورچ
گۆشتەکەی هێنا و کەوچک کەوچک دەیکردە ناو
هەویرەکەوە.



بەڵام لە ناکاو ماشای هاروهاج هاتەژوورەوە و داوایکرد
کە لە دروستکردنی کولیچەی گۆشتدا هاوکاربێت.
ورچەپاندا داوای لە ماشا کرد سەرەتا بچێت دەستەکانی
جوان بە ئاو و سابوون بشوات تاوەکو خاوێن
ببێتەوە.پاشان ماشا جل و بەرگی تایبەتی چێشتخانەی
پۆشی و دەستیکرد بە کارکردن.





بەڵام ماشا نەیدەزانی کولیچەی گۆشت دروستبکات بۆیە
دەیویست یاری بە هەویرەکە بکات و کاتی خۆشی
لەگەڵدا بەرێتەسەر. بەمەش هەویرەکە بەفیرۆ دەچوو.
مام ورچ داوای لێکرد تەماشای ورچەپاندا بکات تاوەکو
لێوەی فێر ببێت ، بەڵام ماشا سەرکێشانە هەویرەکەی بە
تیرۆکەکە پان دەکردەوە.



پاش ئەوەی کە تەواوی هەویرەکە پان بوویەوە ،
دەستیان کرد بە دانانی گۆشتەکە لە ناویدا.
هەر پارچە هەویرێک کەمێک گۆشتیان تێدەکرد و پاشان
دەیانپێچایەوە. بەڵام دووبارە ماشا نەیدەزانی چۆن
گۆشتەکەی تێبکات و بیپێچێتەوە.
هەرچۆنێك بوو ماشا و ورچەپاندا تەواوی هەویرەکانیان
پێچایەوە و خستیانە سەر ئاگر تاوەکو جوان جوان
گۆشتەکە بکوڵێت و دواتر کولیچەکە ببرژێنن. دووبارە
ماشای هاروهاج نەیدەهێشت کولیچەکە بەجوانی
بکوڵێت هەموو خولەکێک سەری مەنجەڵەکەی
دەکردەوە.



مام ورچ و ورچەپاندا هەستیان بە برسێتیەکی زۆر دەکرد. بۆیە بڕیاریاندا فێڵێک لە ماشا بکەن. کاتێک ماشا سەرقاڵبوو ، مام ورچ کۆمەڵێک پەپولەی گرت و لەناو مەنجەڵێکی هاوشێوەی مەنجەڵی کولیچەکەدا داینا. کاتێک ماشا ویستی سەری مەنجەڵەکە لاببات تاوەکو کولیچەیەک دەربهێنێت. تەواوی پەپولەکان بڵاوبوونەوە.



مام ورچ بە گاڵتەوە وتی:"تەواوی کولیچەکان بوون بە پەپولە ،برۆ یەک یەک بیانگرە و بیانهێنەرەوە".

ماشا بەخێرایی بەدوای پەپولەکان ڕۆیشت. مام ورچ و ورچەپاندا دەستیانکرد بە پێکەنین و کاتێک کولیچەکە بەتەواوی کوڵا.بەباشی برژاندیان و کردیان بە سێ بەشەوە ،بە ئاسوودەیی بەشەکانی خۆیان خوارد و بەشێکیشیان بۆ ماشا هەڵگرت.

درەنگانی شەو بوو شوانی مەڕەکان لە ئازاری
ددانەکانی خەبەری بوویەوە. هەرچەندی کرد
نەیتوانی لەتاو ئازاری ددانەکانی بخەوێتەوە.



هەربۆیە بە ناچاری ڕۆیشت بەرەو گەورەکە و
مەڕی ژیری بە ئاگا هێنا و خەبەری کردەوە.
پاشان بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە.



مەڕی ژیر بیریکردەوە کە چۆن یارمەتی شوانی
مەڕەکان بدات و ئازاری ددانەکەی نەهێڵێت.
کتێبی تەندروستی هێنا و بەدوای شێوازەکانی
چارەسەرکردنی ددانی گەڕا.

سەرەتا شوانی مەڕەکان ویستی بە پلایس ددانە
کلۆربووەکەی هەڵبکێشێت. بەڵام ئەم ڕێگەیە
سوودی نەبوو ، چونکە ڕێگەیەکی ناتەندروست و
هەڵە بوو.



مەڕی ژیر دووبارە تەماشای کتێبی تەندروستیەکەی
کردەوە تاوەکو ڕێگەیەکی دیکە بۆ هەڵکێشانی
ددانە کلۆرەکەی شوانی مەڕەکان بدۆزێتەوە.



مەڕی ژیر ڕێگەیەکی دیکەی بۆ هەڵکێشانی ددانی
شوانی مەڕەکان تاقیکردەوە و هەوڵیدا بە
بەکارهێنانی پەمپێک ددانە کلۆربووەکە
هەڵبکێشێت. بەڵام ئەم ڕێگەیەش سوودی نەبوو.

کاتێک ڕۆژ هەڵهات مەڕی ژیر چەندین بیرۆکەی دیکەی بەکارهێنا. بەڵام ئازاری ددانی شوانی مەڕەکان هەر چارەسەر نەبوو.



شوانی مەڕەکان چوو بۆلای
جووتیارەکە و ددانە کلۆرەکەی
پیشاندا تاوەکو ڕێگە چارەیەکی
بۆ بدۆزێتەوە و لە ئازاری ددان
ڕزگاری بکات.





جووتیارەکە بیریکردەوە تا
ڕێگەیەکی گونجاو بدۆزێتەوە.
بۆیە ناونیشانی پزیشکێکی
ئاژەڵی وەرگرت و بڕیاریدا شوانی
مەڕەکان ببات بۆ نەخۆشخانەی
تایبەت بە ئاژەڵەکان.

پزیشکەکە بە کاتێکی کەم ددانە کلۆرەکەی دەرهێنا و شوانی مەڕەکانی لە ئازاری ددان ڕزگارکرد.

لەو ڕۆژە بەدواوە شوانی مەڕەکان هەموو شەوێک بەر لە
خەوتن ددانەکانی جوان بە فلچەو هەویری ددان
پاکدەکردەوە تاوەکو چیتر لە ئازاری ددان بەدووربێت.





لە ڕۆژێکی زستاندا ، بەفرێکی زۆر باری بوو ، بەجۆرێک کە تەواوی کێڵگەکەی سپی کردبوو. کەڵەشێری دەنگخۆشیش بەهۆی ساردی کەش و هەواوە نەیدەتوانی بەباشی بقوقێنێت.

مەڕەکان لەناو گەوڕەکەدا لەسەرمادا هەڵدەلەرزین. بۆیە بە
باشی خۆیان داپۆشی بوو. تاوەکو سەرمایان نەبێت.



کاتێک مەڕی ژیر لەخەو هەستا ، تەماشایکرد شوانی مەڕەکان نەهاتووە بۆ گەوڕەکە و تەواوی مەڕەکانیش لەناو گەوڕەکەدا ماونەتەوە. مەڕی ژیر ویستی دەرگاکە بکاتەوە بەڵام هەرچەند هەوڵیدا دەرگاکە نەکرایەوە. مەڕی قەڵەویش یارمەتیدا بەڵام نەیانتوانی دەرگاکە بکەنەوە.

مەڕی ژیر توشی سەرسوڕمان بووبوو. هۆکاری نەکرانەوەی دەرگاکەی نەدەزانی.





مەڕی ژیر لە پەنجەرەی هەورەبانی گەورەکەوە
تەماشای دەرەوەیکرد ، بینی وا بەفرێکی زۆر
باریوە و دەرگای گەورەکەشی گرتووە.

مەڕەکان کە چاویان بە بەفرەکە کەوت. یەک یەک
بە خلیسکێنە خۆیان هەڵدایە خوارەوە تاوەکو لە
نێو بەفرەکەدا یاری و شەڕەتۆپەڵ بکەن.

جوتیارەکە لە پەنجەرەی ژوورەکەوە تەماشای
کێڵگەکەی کرد ، بینی وا بەفرێکی زۆر باریوە و مەڕەکان
لەناو کێڵگەکەدا یاری و شەڕەتۆپەڵ دەکەن.

له کاتێکدا مەڕەکان سەرقاڵی شەڕەتۆپەڵ و
دروستکردنی شێرەبەفرینەبوون ، لەناکاو
شوانی مەڕەکان هاتە ناو کێڵگەکەوە.



بەڵام شوانی مەڕەکانیش کەل و پەلی
تایبەت بە بەفری هێنا و لەگەڵ مەڕەکان
دەستیکرد بە یاریکردن.

جوتیارەکەش بەهەمان شێوە کەل و پەلی
تایبەت بە کاتی بەفربارینی هەڵگرت و
ویستی بڕواتە دەرەوە. بەڵام بەهۆی
بارینی بەفرەکەوە دەرگاکە نەدەکرایەوە.

بۆیە بە ناچاری جوتیارەکە هەوڵیدا لە سەربانی خانووەکەوە یاری خلیسکێنەی سەر بەفر ئەنجام بدات و پاشان لەگەڵ مەڕەکان دەستبکات بە یاری و شەڕەتۆپەڵ.

لە کۆتاییدا جوتیارەکە بەهۆی ئەوەی کاتێکی زۆر لە بەفرەکەدا مابووەوە نەخۆشکەوت ، بەڵام سەرئەنجام کاتێکی خۆش و ڕۆژێکی دوور و درێژیان لەگەڵ بارینی بەفر و شەڕەتۆپەڵ و یاری خلیسکێنەی سەر بەفر بەسەربرد.

